# خواپەرستە مروارییەکان

{مەریەمی راستگۆ}



١٤٤٤ھ

# خوا پەرستیە مرواریەکان

ئا ئەوەتا مریەمی کچی عمران ڕۆژووو و ساڵەکانی درێژ دەبنەوە وە ئەویش لە نێوان خزمەتکردنی بیت المقدس و وە نوێژ کردن لە میحرابەکەی خۆیدا بۆ الله تعالی بەسەر دەبات ، وە ئەمەش دوای ئەوەی کەوا زکریا علیه السلام بو بە کەفیلی کە زکریا علیه السلام لەو کاتەیا پێغەمبەرو دەمسپی وپێشخراوی ناو بنی إیسرائیل بوو وە ئەمەش لەبەر ئەوەی باوکی مریەم کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی کەوا لە دایک بێت هەر بۆیە مریەمە علیها السلام بە هەتیویی گەورە بوو بە ویستی الله تعالی .

وە الله تعالی ڕێزداری کرد بەوەی کەوا دڵی خەڵکی لە ئاستی ئەودا نەرم کرد **( وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ) آل عِمرَان : ٤٤**

**[وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ]** ئەوکاتەیش ئەوان قەڵەمەکانیان دەهاویشتە» ناو دەریای ئوردونەوە» هەتا بزانن کامیان سەرپەرستی و چاودێری مەریەمی بۆدەبێت، تۆ لەلایاندا « دیارە لەناوخۆیاندا لەسەر چاودێری کردنی مەریەم، هەر کەسە بۆخۆی دەیویست شەرەفی بەخێوکردنی مەریەمی پێ ببڕێ! سەرئەنجام دەستوورێکی خۆیانیان بەکارهێنا- وەک تیروپشک هاویشتن» دەرەنجام بۆ زەکەریا دەرچوو و (خاتوونە مەریەم) درایە دەستی ئەو **[وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ]** وە ئەوکاتەش کە دەمەقاڵێ و هەرایشیان بوو لەلایان نەبوویت، کەواتە: هەموو ئەمانە خوای باڵادەست پێیگوتویت و، مانای وایە تۆ پێغەمبەریت. (تەفسیری ڕامان)

وە الله تعالی ڕێزداری کرد بەوەی کەوا لە نیعمەتەکانی خۆی پێ بەخشی ( **كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًاۖ قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِۖ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ** ) **آل عِمرَان : ٣٧**

وە خوای گەورە ڕێزی لێنا بە وەی کەڕامات و بەخششی تایبەتی پێدا وەکو دەفەرموێت

**[كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًاۖ ]** پاشان کە مەریەم گەورە بوو هەر جارێکی زەکەریا لە حوجرەکەیدا سەری لێدەدا دەیدی جۆرە میوەو خۆراکێکی لایە لەوکات وجێگایەدا نەبوو، بۆیە بە سەرسوڕمانێکەوە **[قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ]** زەکەریا دەپرسێ: ئەرێ مەریەم! تۆ ئەم میوەو رزق ورۆزییەت لەکوێ بوو؟ **[قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّـهِۖ]** ئەویش گووتی: لەلایەن خواوە بۆم هاتووە **[إِنَّ اللَّـهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ]** بەڕاستیی خوا بە هەرکەسێک بیەوێت رۆزی بدات، بێ ژمارەو بێ ماندووبوون و عەزیەتکێشان دەیداتێ. لە (موسلیم)دا هاتووە: **((كُلُّ بَنِي آدَمَ يَمَسُّهُ الشَّيْطَانُ يومَ ولَدَتْهُ أُمُّهُ، إلا مَرْيَمَ وابْنَهَا))** صحيح مسلم، كتاب الفضائل، باب فضائل عيسى عليه السلام، حديث: ٤٤٦٧. واتە: هەر منداڵێ کە لە دایک دەبێت شەیتان تیی ئەکوتێ و ئەزیەتی دەکا، خاتوومەریم و کوڕەکەی نەبێت، چونکە دایکی مەریەم دوعای بۆکردن و گوتی: **(إِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ).**

تەفسیری ڕامان

وە الله تعالی ڕێزداری کرد بەوەی کەوا پاکی ڕاگرت و وە هەڵی بژارد وە کردی بە دایکی یەکێک لە پێغەمبەرە هەرە گەورەکانی بنی إسرائيل وە پەیامبەرێک لە پەیامبەرەکانی أولو العزم کە ئارامگر و کۆڵنەدەر بوون لەسەر گەیاندمی پەیامەکەیان،سەعدی دەڵێ لە تەفسیرەکەیدا:
(( یەکێک لە گەورەترین فەزلەکانی مریەم عليها السلام ئەوەیە کەوا لە کتێبێکدا ناوی هێنراوە کەوا موسوڵمانەکان دەیخوێننەوە لە ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا ، تیایدا بە باشترین باس باس دەکرێت و بە باشترین ستایش ستایش دەکرێت ، لە پاداشتی ئەو کار و کردەوە چاکانەی کەوا دەیکرد وە ئەو کۆششەی کەوا دەیکرد )) لە قورئانێ پیرۆزا ناوی هێندراوا کە گەورەترین کتێبە

وە لەناو ئەم هەموو وانانەو پەندو ئاڕاستە کردن و پەروەردە قورئانیانەدا بۆ ئافرەتی بڕوادار ڕێگەی بەرزێتی و بەرزبونەوە لە پلیکانەکانی بەندایەتی ڕێبازی هەڵبژاردنی پەروەردگار بۆ ئەم ئافرەتە بڕواداره دەکێشێ(واتە هەر ئافرەتێکی بڕوادار دەیەوێت وەك مەریەم خوای گەورە هەڵی بژێرێت و ببێت بە بڕوادارێکی ڕاست و سەنگین با وەك مەریەم بێت لە سیفات و کردارد)

مەریەمی کچی عمران ...... ئەو ئافرەتەی کەوا الله تعالی هەڵیبژارد لەسەر ئافرەتانی جیهان .

مەریەم کچی عمران چۆن شایستەی ئەم ستایشەی الله تعالی بوو لە چەندین شوێندا ؟ وە لەم شوێنانە بە تفسیل و بە إجمال ، وە ئەو ئایەتەی کەوا تیایدا سیفەتەکانی مریەمی علیها السلام تێدا کۆبۆتەوە لە قەولی الله تعالی : **( وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ ) التَّحْريم : ١٢**

مەریەم شەرمی خۆی لە حەرام پاراست:

**[١٢وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا]** وە خوا نموونەیەکی تر دێنێتەوە بە مەریەمی کچی (عیمران) ئەو ژنەی داوێنی خۆی پاراست لە حەرام **[فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا]** ئینجا ئێمەش لە رێی ئەو (ڕوح)ـەی خۆمانەوە (جبریل) فوومان پیاکردو دووگیان بوو بە عیسا «سەلامی لەسەر بێ».

**(قال المفسرون: إنه أراد بالفرج هنا الجيب.. لأنه قال: ونفخنا فيه من روحنا، وجبريل-عليه السلام- إنما نفخ في جيبها ولم ينفخ فى فرجها).** واتە: ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: مەبەست بە (فەرج) لێرەدا (جَیْب)ـە، واتە: جبریل فووی بە شەرمگای مەریەمدا نەکردووە، بەڵکو فووی بە شوێنێکدا کردووە، وەکو گیرفانی وابووە.

وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ ] وه ئەویش ددانی نا به هەموو وتەو فەرمانەکانی خواو کتێبەکانیدا، ئەوانەی ناردبوونی بۆ پەیامبەرانی پێشین [ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ ] وه بەردەوام له ڕیزی خەڵکانی فەرمانبەرداردا بوو، هەزاران هەزار سڵاوی لێ بێت. له فەرمودەیەکدا هاتووه که ئیمامی (بوخاریی)و ئیمامی (موسلیم) هێناویانه: ((كَمَلَ مِنَ الرِّجالِ كَثِيرٌ، ولَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّساءِ إلّا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرانَ، وآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وفَضْلُ عائِشَةَ علَى النِّساءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ علَى سائِرِ الطَّعامِ)) صحيح البخاري، كتاب الأطعمة، باب الثريد، حديث: ٥١٠٧، صحيح مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل خديجة أم المؤمنين، حديث: ٤٥٦٣. واته: خەڵكێکی زۆر له پیاوان پێگەیشت و کامڵ بوون، کەچی له ژنان تەنها ئەم چوار ژنه گەیشتنه کەماڵ: ئاسیەی ژنی فیرعون، مەریەمی کچی عیمران، خەدیجەی کچی خوەیلد، وه فەزڵ و ڕێزی (عائیشه)یش بەسەر ژنانی تردا وەک فەزڵی (تشریب) وایه بەسەر تەواوی خواردنەکانی تردا، دیاره ئەو خواردنه لای عەرەبەکان زۆرخۆش و به حورمەت بووه.

تەفسیری ڕامان

وه ئەگەر سەرسام بویت ئەوا با سەرسامیەکەت به کۆتایی سورەی تحریم بێت ئەم سورەته کەوا چارەسەره بۆ چاکسازی هاوسەر و خێزان که تیایدا الله تعالى کۆتایی پێهێناوه به ئاماژه کردنی بۆ ئەم ئافرەته پاکه چاکەکاره ، بۆ ئەوەی ببێت به پێشەنگ بۆ ئافرەتان ، وه بۆ ئەو ئافرەتانەی کەوا هاوسەر دارن و سەڵتن ، وه نموونەیەک بۆ ئەوانەی کەوا باوەڕیان هێناوه ، چۆن نابێ به نموونه له کاتێکدا پێغەمبەر ( صل الله علیه و سلم ) له وەسفی مریەمدا علیها السلام فەرموویەتی : (( هیچ ئافرەتێک کامل نەبوه جگه له مریەمی کچی عمران و آسیای خێزانی فیرعەون )) وه پێغەمبەر ( صل الله علیه و سلم ) فەرموویەتی ( باشترین ئافرەت مریەمی کچی عمرانه وه خدیجەی کچی خویلده ) .

## العبوديه طريق الاصطفاء

## واتــه : خودا پەرستی ڕێگـایـه بـۆ هەڵبژاردن

مریەم علیه السلام تـێکۆشانێکی زۆری دەکرد لـه خـودا پەرستی و پارێزگاری دەکرد له نوێژەکانیدا وه ئەمەش ڕێگایەک بوو له ڕێگاکان بۆئەوەی که خودای گەوره هەڵی بژێرێت و ڕێزداری بـکـات

خودای گەوره فەرمووی { وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ {٤٢} يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ) آل عِمرَان : (٤٢ _ ٤٣ )

واتـــه : مەریەم خاتوون له ژنانی دنیا له بان تره:

ئەوکاتەش وەبیربێنه که فریشتەکان -جبریل- بەفەرمانی خوا - بەمریەمی گووت! بەراستیی خوا تۆی دەستنیشانکرد بۆ کارێکی زۆرگرنگ،

دەسا مەریەم !

تۆیش لەبەرامبەر ئەوەوە یەکلابه بۆ پەروەردگارت و، ملکەچ و خۆ بەکەمزانبه. سوجدەو کڕنووش لەگەڵ رکوع بەراندا ببه

، واته: لەگەڵ نوێژکاراندا نوێژ بکەو لەگەڵیان به.

ئـەم خطابه کـەوا مەلائیکـەت ئـاراستـەی مریـەمیـان کـرد علیه السلام ئـەوەمان بۆ ڕوندەکـاتـەوه کـه هەڵبژاردنی خودای گـەوره له گوێڕایەڵی کردنه بۆ خودای گـەوره وه پەرستنیەتی وه بەردەوامی له سجود و رکوع بۆیـەتی

ابن كثير وتی :مەبەست لەم ئایەتە ئـەوەیە کـە خودای گـەورە هەڵی بژارد لەبەر زۆری عیبادەتی و لەبەر زوهدی و شـەرەفی وە پاکێتی لە وەسوەسە وە دووەم جــار هەڵی بژارد لەبەر ڕێزی بەسەر هــەموو ئافرەتــانی جیهاندا .

مریەم علیە السلام جێگیر بوو بە شوێنی نوێژەکەی خـۆیەوە و هەرگیزیش بە جێی نەدەهێشـت تەنها بۆ خزمەتکردنی (بیت مقدس) نەبێت یاخود بـۆ پیویستیەک لە پێداویستیەکانی خـۆی نەبێـت کــەوا پێویست بوو ئەنجامی دات وەکــوو { خــواردن و خۆپاکردنەوە }

## " الصطفاء  واتــه { هەڵبژاردن }

کـە ئەمەش هەڵبژاردنی خودای گـەورە بــوو بۆ مریەم علیه السلام کاملی کرد و پاکی کردەوە
ئەمەش تەنها دوای ئەوە بــوو کـەوا خودای گــەورە تەوفیقی پێ بەخشی بەوەی کـەوا بەکاتێکی دوورودرێژ خودای گـەورەی دەپەرست وە بە باشی خۆشوعیەی دەکرد لــە نوێژەکانیدا وە زۆر یادی خودای گەورەی دەکرد لە محرابەکەیدا

وە ئەمەش ئەوەیە کـە خودای گـەورە لە ئافرەتی بڕوادار خۆشی دەوێت کەبەجوانی عیبادەتی خودای گـەورە بـکات وە زۆر لە ڕکوعدا بمێنێتەوە وە لە سجودەکاندا لە خوای گەورە نزیک ببێتەوە
بەمەش خودای گـەورە بەرەکەتی تێدا زیاد دەکـات و پلەی بەرز دەکاتەوە و ڕێنمای دەکـات بۆئەوەی کـەوا پاک و خاوێن بێتەوە لە پیسیەکان و ئاراستەی دەکـات بۆ کاملیەتی مرۆڤایەتی

هەر بۆیـە خودای گەورە وەسفی ئەوانە دەکات کە هەڵبژێردراون و پاک ڕاگیراون وە هەڵبژێردراون بە فەرمانی خـۆی بەهۆی ئەوەی کـەوا زۆر عیبادەتی خودای گەورەیان کردووە و لە خشوعی خودای گـەورە زۆر دەمانەوە

**( يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ) آل عِمرَان : ٤٣**

دەسا مەریەم! تۆیش -لەبەرامبەر ئەوەوە- یەکلابە بۆ پەروەردگارت و، ملکەچ و خۆ بەکەمزانبە. سوجدەو کڕنووش لەگەڵ رکوع بەراندا ببە، واتە: لەگەڵ نوێژکاراندا نوێژ بکەو لەگەڵیان بە.

**{والقنوت فى أصل معناه : الطاعه في خشوع }**

واتــە قنوت لە ئەسڵدا بە واتای گوێڕایەڵی کردن دێت بـە خشوعەوە

وە لێرەدا مانایەکی تایبەتتر لەخۆ دەگرێت

هەر وەک وتەی فریشە بۆ مریەم علیە السلام کە پێیان ڕاگەیاند لە لایان خودای گەورەوە ( أقنتی ) واتــە لە نوێژدا زۆر بمێنەوە و نوێژت درێژ بکەوە کە ئەمەش وتــەی گشتی زانایـانــە

هەر بۆیـە فەرمانی خودای گەورەی جێبەجێ کرد و لە نوێژدا زۆر مایەوە هەتاوەکوو پێیەکانی هەڵاوسان و هەر وەکو مجاهد باسی کردووە

وە هەروەها زانایان باسیان کردووە کە زۆر مانەوەی لە نوێژدا دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کـەوا زۆر پارێزگاری لە نوێژەکانی کردووە وە خشوعی هەبووە و درێژی کردووەتەوە لە نوێژەکانی وە لە سجود و ڕکوعدا زۆر زۆر دەمایەوە

هەروەها بە چاککردنی عیبادەت و پارێزگاری کردن لە مافەکانی خودای گەورە و سەیر کردنی نیعمەتەکانی ئەمە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی مرۆڤ بۆ پلەیەکی زۆر بەرز

وه هەر ئەمەشە ئیمانەکەی دەگەیەنێت بە پلەی یەقین بەڵام بەندەش لەسەری پێویستە کەوا تێکۆشان بکات دژی نەفسی خۆی و دژی شەیتان بۆ ئەوەی کار و عیبادەتەکانی بە بەردەوامی بکات

پاش ئەوە پێویستە لەسەری کەهەوڵی تەواوی خۆی بدات بۆ جێبەجێ کردنی واتاکانی پەرستن لە پەرستنی کە بەدڵ ئەکرێت و ئەو پەرستنەی کەوا بە عەمەل دەکرێت وە پێویستە لەسەری کە بەردەوام بێت لە ئاشکرا و لە نهێنیدا لەو کاتەی کە بەتەنهایە لەو کاتەشی کەوا لەناو کۆمەڵدایە وەلە پەنهایی و لە ئاشکرادا ..

هەر وەک خودای گەورە دەفەرمووێ **{ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ}.. (العنكبوت : ٦٩)**

واتــە : وە ئەوانەش لە پێناوی ڕەزامەندی ئێمەدا هەوڵ و کۆشش و جیهادیان کرد، ئەوە بێگومان ئێمەش ئەوان ڕێنمایی دەکەین بۆ ڕێگاکانی بەهەشت و گەیشتنیان بە ئێمە، بەڕاستی خوا بەردەوام لەگەڵ چاکە کاراندایە،

واتە: لەگەڵ ئەوانەدایە کە بەڕاستیی جیهاد دەکەن، بە یاریدەدان و سەرخستن.

کار و باری دونیا بونی نەبووە لـە هەڵبژاردن و لە ڕێزدارگرتن

مریەم علیه السلام بە یەتەمی گەورە بـوو دوور بوو لە هەموو ئەو شتانەی کەوا ئافرەتانی تر پێوەی سەرقاڵ بـوون کە هیچ سودێکی نیــە

وە هەروەها مریەم علیه السلام دڵی پاک بـوەوە لە خۆشەویستی دەرکەوتن و ناوبانگ ئەمەش وای لێ کرد کەوا شوێنێکی دوور هەڵبژێرێت دوور لە چاوی خەڵکی و تێکەڵاویان نەبێت

هەر وەکو خودای گەورە دەفەرمووێ **{ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا (١٦) فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ) مَريَم : { ١٦_١٧ }**

واتــه : مەریەم و لە دایبکبوونی عیسا:

لەم قورئانەدا باس و یادی (مەریەم)یش بکە، لەم باسەدا داستانێکی سەر سوڕهێنەر دەبیسیت! کاتێ دوور لە کەسوکاری کەناری گرت و جێگایەکی خۆرەڵاتی بۆ خۆی هەڵبژارد بۆ خواپەرستیی، واتە: لەبەشی خۆر هەڵاتی قودسدا.

لە نێوان خۆیی و ئەواندا پەرەدەیەکی دانا تا چاکتر بتوانێ خواپەرستیی بکات ئێمەیش ڕۆحی خۆمان (جبریل) نارده لای ئەوسا لە سیمای پیاوێکدا نەک لە شێوەی فریشتەدا خۆی نیشانداو هاتە بەرچاوی تا نەترسێ و کارەکەی لاقورس نەبێتابن عطیه وتی : ( الانتباذ) واتا دورکەوتنەوه

سعدی وتــی : ( انتبذت لتطهر من حیض ) واتا دورکەوتوەتەوه بۆ ئەوەی پاک بێتەوه لە عادە وە جگە لەوانیش وتیان بۆئەوەی کە خودای گەورە بپەرستن

وە جگەلەوانیش وتیان بۆ ئەوەی الله تحالی بپەرستێ ، وە ئەمەش کەئەم قەولەش چاکترین یانە, ئەمەش لەبەر ئەوەی کەوا مەریەم علیە سلام لەسەر سەدانەی پەرستگاکە وەستابو وە خزمەتی دەکرد ،واتا مەریەم علیە سلام لەپەرستگاکەیا لە (بیت المقدس )هەم خزمەتی (بیت المقدس) ی ئەکرد وەعیبادەتی الله تحالی ئەکرد ، وە لەبەر ئەمەش لە خەڵکی دوور کەوتەوە ، هەروەها هەروەکو چۆن مەریەمە علیە سلام رازی بو بەوەی کە الله تحالی بۆی نوسیبو لەرزقو ڕۆزی وەهەر چیەکیشی لەڕزقو ڕۆزی دەست ئەکەوت دەی گەراندەوە بۆ لای الله تحالی ، چاکەی هیچ کەسێکی بەسەر خۆیەوە نەدەبینی جگەلە چاکەی الله تحالی بەسەریەوە،

وەهەچ کاتێ زەکەریا علیە سلام بچوبایە ژورەکەی خواردنی لەپێشی ئەبینی کەوا لەکات و ساتی خۆی نەبو خواردنەکان ، بۆیە زەکەریا علیە سلام لێی ئەپرسێ لەسەرچاوەی ئەم خواردنانەو وە لەکوێ وە دەستی کەوتوە ، وە مەریەمە علیە سلام هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە جگەلەوەی کەدەی وت کەوا لەلایەن الله تحالی وەیە،ئەم وەڵامە جەندە جوانە وەڵامێکی کورتو جوان بە یەقین بە الله تحالی وە رازی بون بە کارەکانی وە سوپاس کردنی بە بەخشیشەکانی ، وە گەراندنەوەی هەمو ئەم چاکانە بۆ لای الله تحالی ، وە بەئەدەب بون لەگەڵ الله تحالی ، وە ملکەچی دەبو تەنانەت بەخششەکانی الله تحالی ستر دەکرد ، وە ئەم وەڵامە کورتە چەن پاکە بۆدڵ و بۆ دوربون لە گومڕای ، وەدورکەوتنەوەی نەفس لەکەموکورتیەکان ، وە پەیوەست بونی روحی بە بەخۆبەری کردن لێیان ،

وباشترین پلەکانی (الاحسان)ئەوەیە کە الله تعالی بپەرستیت و دڵتــ پاک بکەیتەوە بۆ الله تعالی و ئەمەش ئەتگەڕێنێتەوە بۆ ئەسڵی وشەی قنوت و ئافرەتی قانیتەئەوەیە کەوا عیبادەتەکانی زۆر بە چاکی ئەنجام ئەدات تاوەکو الله تعالی هەتاوەکو نیەتی دڵی پاک دەکاتەوە بۆ الله تعالی الله اکبر لەم پلە وپایە بەرزە الله اکبر لەم پلە و پایە سونیە لعلك لحظت و لەوانەیە تێبینی شتێکت کردبێ کە تیایدا باسی ئەو کار و کردەوانەمان کرد کە بە دڵ ئەنجام دەدرێت

کەوا  مریەمە علیە سلام ئەنجامی دابوو واتای (الاحسان)ــە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فێرمانی کردووە لە حەدیثە بەناو بانگەکەی جبریل علیە سلام کاتێک فەرموویی:الاحسان بریتیە لەوەی کە الله تعالی بپەرستی هەروەکو ئەوەی کە دەیبینی و ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەوا الله تعالی دەتبینێت هەر بۆیە ئیمان و تەوحید و گەڕانەوەی شتەکان بۆ الله تعالی و تەوەکول کردن بە الله تعالی و الله تعالی بپەرستێ وەک ئەوەی کە دەیبینێ بە گەورە دانانی الله تعالی و بە شەرمەوە و بە خۆشەویستیەوە و بە ترسەوە ئەمەش پلەی الاحسانە و ئەمەش ئەوە بوو کە مریەم علیە سلام لە سەری بوو الله تعالی دەپەرست و هیچی نە دەبیینی جگە لە ڕەحمەتی الله تعالی  و  هیچی بەر نەدەکەوت ئیلا سۆز و بەزەیی الله تعالی نەبێت و هەستی بە هیچ شتێک نەدەکرد ئیلا نزیکی نەبێت لە الله تعالی هەر بۆیە ئەمە بووە هۆی ئەوەی کەوا لەسەر چاکە گەورە ببێت و زەکەریا علیە سلام کەفارەتی بکات و بووە هۆی ئەوەی کە ڕزقی فراوان بێت و بووە هۆی ئەوەی کەوا هیدایەت بدرێت و دڵی چاکەکار بێت و هەروەها مریەم علیە سلام زۆر سوپاسگوزاری الله تعالی بوو لەسەر هەموو ئەم شتانە وگوێڕایەڵی الله تعالی بوو و نوێژی دەکرد بۆ الله تعالی بە باشترینی نوێژەکان کە ئافرەتێک بتوانێ بیکات ئەوە بووگەیشت بە بەرزترین پلەکانی الاحسان بوو بە یەکێک لە ڕاستگۆیان  هەروەکو الله تعالی وەسفی کرد لە **سوڕەتی [المائدة] آیة : ٧٥( مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ) المَائدة : ٧٥**

مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ شتێک نی یە (نە خوایە و نە کوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێکی خوا نەبێت، بە ڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابوردوون، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە، هەردووکیان خواردنیان دەخوارد (وەکو هەموو ئینسانێک) سەیر بکە و سەرنج بدە (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) چۆن هەموو فەرمان و بەڵگەیەکیان بۆ ڕوون دەکەینەوە، لەوەودوا تەماشاکا چۆن ڕوویان لە حەق وەردەچەرخێنرێت و لەڕاستی لادەدرێن! کاتێک کەسەیری نەفسی خۆم کرد ، وە غەمباری کرد بەوەی کەوا مریەمی ڕاستــگۆ لەسەری بــوو لە چاکەکاری و ڕاستگۆی و خۆ بەدەستەوە دان بۆ خودای گــەورە

وەبینیم کـەوا نەفسی مـن زۆر دورە لە قورئان دورە لەوەی کەوا قورئان بکـەم بە پێشەنگی خـۆم وە کەمتەر خەمم بەرامبەر بە مافەکانی خودای گــەورە هیچ چاکەکار نیە و هیچ گوێڕایەڵ نیـە بۆیە دڵم زۆر گریا بە حاڵی خۆم

وە هەروەها شەقوای حاڵی خۆمم کرد بۆ خودای گـەورە وە داوا لە خوای گەورە ئەکەم کە من و تۆش بکات بـە چاکەکاران وە لە تۆبەکاران و سوپاس گوزاران

هیچ شتێک سەرکەوتنت بۆ ناهێنێت بە ئەندازەی پشت بەستن بە خودای گەورە و دوعا کردن

# پاکێتی کلیلی ڕێزلێنانە

مریەم علیە السلام لە بنی إسرائیل گەورە بـوو بە گەورەبوونێکی ڕێزدار یەکێک بوو لە خوا پەرستە بەناوبانگەکان کە هەمیشە بە عیبادەتەوە سەرقاڵ بـوو

(والتبتل والدؤوب)

{والتبتل } واتــە کەسێک کەوا زەواجی نەکردووە بەڵام لەبەر هۆکاری ئەوەی کەزۆر خودا پەرستە

وە { والدؤوب} واتــە زۆر تێکۆشان ئەکات بـۆ پەرستنی خودای گەورە

هەروەها لە کەفالەتی مێردی خوشکەکەی بوو زکریا علیە السلام لە بەنی إسرائیلە کە لەو کاتەیا گەورە و پێغەمبەریان بـوو کە لە بابەتی دیندا ئەگەڕانەوە بۆلای ئــەو

وە هەروەها زکریا لە مریەم علیە السلام ڕێزێکی زۆر زۆری دەبینی

وە لە ناوچـەی ڕۆژهەڵات لە بەیتی ( مقدس)

وە ئەو ماڵانەی کەوا لە چواردەوری بـوون

دوای ئەوەی کە چەند ساڵێکی بەڕێکرد لـە عیبادەتی خودای گـەورە لە مزگەوتی ( أقصى)

کە هەرگیز محرابەکەی خــۆی بەجێنەدەهێشت تەنها بـۆ پێویستیەکی خـۆی نەبێـت

بۆخۆی شوێنێکی تاییەتی هەڵبژاردبوو کـەوا لە خەڵکی جیادەکردەوە

دوور بـوو لـە خێزانەکەی و لەهەموو خەڵکیش

فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ کرد بە درێژ کردنەوەی نوێژەکانی و بەردەوامی لەسەری

وە کاتێک کەوا ئـەو لە تەنهایدا بـوو لـەو کاتەدا ئەمرێکی زۆر گەورەی بۆ هات کە تەنهاییەکەی شکاند .

پیاوێکی بینی لەسەر وێنەیەکی زۆر زۆر جوان کە هیچ عەیبێک و هیچ کەموکوریەکی تێدا نەبوو کەوا خودای گەورە دروستی کردووە و کاملی کردووە ئەو پیاوەش ( جبریل ) بوو علیه السلام

بە ئەمرێکی خودای گەورە هاتبوو بۆلای مریەم علیه السلام کاتێک مریەم علیه السلام ئەمی بینی لە کاتێکدا کە ئەو کچێکی گەنج بوو

و هەردوکیان لەو کاتە لە تەنهایدا بوون هیچ کەس ئەوانی نەدەبینی

وە مریەم علیه السلام نەیدەزانی کە ئەو جبریلە ئەو تەنها وایدەزانی کەئەو پیاوێکە هاتووە بۆئەوەی کەوا شتێکی بەسەر بهێنێت توشی کارێکی بکات کەوا خودای گەورە پێی ناخۆشە

أبن جريج لەم حاڵەتەیا دەفەرمووێ { مریەم علیه السلام دەترسا لەوەی کەوا توشی کارێکی بکات کەوا خودای گەورە پێی ناخۆشە هەر بۆیە هاواری کرد و پەنای گردت بە خودای گەورە لەو کەسە }

**( قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ) مَریَم : ١٨**

واتــە : کاتێ کە چاوی پێکەوت ترسا خراپەکار بێت بۆیە گوتی: بەراستیی من پەنا دەبەمە بەر خوای بەبەزەیی لەزەرەرو زیانی تۆ

دەسا ئەگەر تۆ کەسێکی خۆپارێزو لەخوا ترسبیت، لێمەوە نزیک مەبە.

مریەم علیه السلام یەکەمجاری بوو کەوا تاقیبکرێتەوە بە پاکێتیەکەی چونکە ئەو دوور بوو لە هەموو ئەو کارانەی کەوا زەرەو فاحیشە و خراپەکاری دەبەن وە هەموو ئەو هۆکارانەشی کەوا بەرەو کاری خراپەی دەبەن لە یەکەم ساتی ژیانیەوە

وە هەروەها پاداشت دانەوە لە خودی کارەکەیە

کاتێک کەوا مریەم علیه السلام جبریلی بینی

له کاتێکدا کەوا لێی دەترسا

لەو کاتیا جبریل علیه السلام موژدەی پێدا بە فەرمانی خودای گـەورە  وە هەڵبژاردنی بەوەی کە دوگیانە بە عیسا علیه السلام کە دەیهێنێتە دونیاوە .

**( قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا ) مَريَم : ١٩**

واتــە : جبریل وتی: مەترسە بـەراستیی من تەنها هەر ڕەوانە کراوی پەروەردگاری تۆم، ئەوکەسە نیم لێی ئەترسیت هاتووم بە فەرمانی خوا کوڕێکی چاک و پاکت پێببەخشم.

جبریل علیه السلام پێی ڕاگەیاند کە ئەمە لە لایان خودای گەورەوەیە کەوا فوی پێیا بکـات بـە یاخەی قەمیسەکەی ئەم فوە کە پێیدا دەکات بە یاخەی قەمیسەکەی بە ئەمری خودای گەورە ئەم فوە لە ڕەحمیدا جێگیر دەبێـت

لەو کاتەیا منداڵێکی بۆ دروست دەبێت لـە ڕەحمیدا  ئەو منداڵەش عیسا علیه السلام بـوو

هەربۆیە مریەم علیه السلام بەهۆی ئەم فوە موبارەکە دوگیان بـوو

مریەم علیه السلام زۆر سەرسام بوو بەم کارە و پێی سەیر بـوو وە پرسیاری دەکرد لە چۆنێتی هێنانە دونیای ئەم منداڵە لە کاتێکدا کە ئەم زەواجی نەکردووە وە ئەو کەسێکە کەوا پاکیزەیە

**( قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا {٢٠}  قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ۖ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا ۚ وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ) مَريَم : (٢٠_٢١**

واتـە : مەریەم وتی: جا من چۆن کوڕم دەبێ؟!

کە تا ئێستا شوم نەکردووەو  هیچ کەسێک دەستی لێ نەداوم

و  هەرگیز کەسێکی داوێن پیسیش نەبووم .

جبریل وتی: بڕیار بەم شێوەیە

و پەروەردگاری تۆ فەرموویە: ئەم کارە «بەخشینی منداڵ» بێ شووکردن بۆ من ئاسانە بۆ ئەوەی بیکەینە ئایەت و نیشانەیەک بۆ مەردوم لەسەر دەسەڵاتی خۆم چاکەو میهرەبانییەکیش بێت لەئێمەوە،

چونکە ئەو منداڵە دەکەمە پەیامبەرو ڕێ نیشاندەر ئەم مەسەلەیەش بڕیارێکی بڕاوەیەو هەر پێش دێ، بەهیچ شێوەیەک ناگۆڕێ و قسەی ناوێ.

ئینجا مەریەمە علیها السلام دووگیان بوو بەبێ ئەوەی هەڵبژاردەی خۆی بێت وە ئارامی گرت لەسەر فەرمانی خوای گەورە بەڵام ئەو ترسا لە ئابڕووچوون وە لە قسەی خەڵکیش ترسا لەبەر ئەوەی کەوا خەڵکی بڕوای پێناکەن لە کارێکدا کەوا ناڕوونە و بەبێ زواجیشە ، چۆن ئەو لە کیژۆڵەیەکی خوا پەرستی بەناوبانگ بە عیبادەت و خۆ بە دوور گرتن لە هەموو تاوانێک لە ناکاوێکەوە لە پێش چاوی خەڵک بوو بە کەسێکی خراپەکار ! لەو کاتەیا تووشی ئازارێکی زۆری دەروونی بویەوە لە ئەنجامی ئەم سکپڕیەی هیچ کەسێک نەیدەزانە جگە لە خودای گەورە لەگەڵ ئەوەی کەوا ئازارێکی دەروونی زۆری هەبوو ئازارێکی جەستەیی زۆریشی هەبوو لە سەرئەنجامی دووگیانیەکەی ، وە لەو دۆخەی خۆی دەرچوو کەوا خەڵکی دڵیان لەسەری نەرم بوو وە لەو حاڵەتە دەرچوو کەوا خەڵکی سۆزیان بۆ دەچوو وە مانەوەی بە تەنهایی بۆ عیبادەت کردن وای لێکرد کەوا بچێتە دۆخێکی نالەبارەوە وە ترس لە قسەی خەڵکی و لە خێزانەکەی وە هەروەها چاودێری ئەوەی دەکرد کەوا چی بەسەر دێت سەر ئەنجام نیشانەکانی دووگیانی تیا دەرکەوت وە لە خەڵکی دوور کەوتەوە و بەجێیانی هێشت الله تعالی فەرموویەتی : **( فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا ) مَريَم : ٢٢**

منداڵ له تۆلی مەریەمدا دروستبوو:

**[٢٢ فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا]** بەڵێ دوای وتووێژەکەی جبریل، مەریەم خۆی دایه دەستی قەزای خواو، جبریلیش بەفەرمانی خوا فووی پیاکردو دەست بەجێ سکی پڕبوو بەو کۆرپە پاک و چاکەیە، ئینجا لە (بیت المقدس) کە هێشتا منداڵەکە لە سکیا بوو بە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە خۆیگەیاندە شوێنێکی دوور، نەوەک تانەو تەشەری لێ بدەن و تۆمەتباری بکەن.

تەفسیری ڕامان

ڕایکرد بۆ شوێنێکی زۆر دوور لە ترسی ئەوەی کەوا ئابڕوی نەڕوات ، ابن إسحاق وتی : (( هیچ کەسێک لە خێزانەکەی نەچوون بۆ لای مەریەمە علیها السلام جگە لە زەکەریا نەبێت ، وە قسە لە ناو بنی إسرائیل بڵاوبۆوە ، وتیان : بەڕاستی باوکی مناڵەکەی مەریەمە یوسفە ( یوسف ئەو دارتاشە بوو کەوا خزمەتی پەرستگاکەی دەکرد لە مزگەوتدا ) وە هیچ کەسێکی تر لە کەنیسەکەیا لەگەڵی نەبووە جگە لە یوسف نەبێت و توارت من الناس )) هەر بۆیە مەریەمە علیها السلام لە بیت المقدس دەرچوو ڕای کرد لە دەستی قسەی خەڵکی وە ترسا لە نفسی خۆیی و کۆرپەکەی هەر بۆیە ڕۆیشت بۆ گوندێکی دوور لە شارەکە کە چەند میلێک لێی دوور بوو ، کە ئەویش بیت لحم لەسەر زۆری وتەی اهلی علم کەوا دەڵێن بیت لحم بوە .

وه کاتێک کەوا وادەی منداڵبوونی نزیک بوویەوە ئازاری منداڵ بوونەکەی بەرەو دار خورمایەک بردی کاتێک کەوا ئازاری منداڵ بوونەکەی تیمی بۆ هێنا وه هیچی پێ نەبوو لە خواردن و خواردنەوە وه دڵی بە ئازار بوو لە قسەی خەڵکی وه ترسا لەوەی کەوا ئارام نەگرێت هەر بۆیە لەو کاتەیا ئاواتی بەوە خواست کەوا بمردبایە بەر لەوەی کەوا ئەمەی بەسەر بهاتبایە لەو کاتەدا لەبیر کرابوو هیچ کەسێکیش ناوی نەدەهێنا ، الله تعالی فەرمووی : **( فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ) مَريَم ٢٣**

**[٢٣فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ]** ئینجا ژانی منداڵبوون گرتیی و بردییە لای بنە دارخورمایەک، تا لەکاتی منداڵبووندا لێی بخواو، پاڵیشی پێوە بدات **[قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا]** ئەوسا لەبەر پەرێشانیی و حەیاو شەرمی خۆی گوتی: خۆزگایە پێش ئەم ڕووداوە مردبام **[وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا]** و بە یەکجاری لەبیر بچوومایەوەو هەرگیز باس نەکرابام .

تەفسیری ڕامان

هەر بۆیە عیسی علیه السلام لە دایک بوو ، هەر بۆیە الله تعالی لەسەر دەستی عیسی علیه السلام پاکیەتی و ڕاستگۆیی مەریەمە علیها السلام چەسپاند ، وه الله تعالی عیسی علیه السلام ناردی بۆ بنی إسرائیل وەکو پێغەمبەرێک .

الله سبحانه و تعالی فەرموویەتی : **( وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ ) الأنبيَاء : ٩١**

باسی مەریم و عیسا (درووديان لێ بێ):

**[٩١ وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا]** هەروەها وەبیر بێنە (خاتوو مەریەم) ئەو ژنەی کە شەرم و داوێنی خۆی پاک و خاوێن ڕاگرت و پاراستیی لە حەرام، بۆیە ناوی مەریەمی نەهێنا، بەڵکو فەرمووی: (والتي..) چونکە لێرەدا مەبەست باسی پێغەمبەرانەو، تەنها کوڕەکەشی (عیسا) لە زنجیرەی پەیامبەرانە، نەک خۆی [فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا] ئینجا ئێمەش بەهۆی فریشتەی خۆمانەوە «جبریل» فوومان پێدا کردو بوو بەهۆی سک پڕبوونیی و عیسای لێ بوو!! (شێخی سابوونیی) لەپەراوێزی (ئیبن کەسیر)دا دەڵێ: **(الْمُرَادَ بِالْفَرْجِ: فَرْجُ الْقَمِيصِ، أَيْ لَمْ تَعْلَقْ بِثَوْبِهَا رِيبَةٌ، أَيْ إِنَّهَا طَاهِرَةُ الْأَثْوَابِ. قَالَ السُّهَيْلِيُّ: فَلَا يَذْهَبَنَّ وَهَمُكَ إِلَى غَيْرِ هَذَا..).**

واتە: مەبەست بە بێژەی (فەرج) یەخەی کراسەکەی خاتوو (مەریەم)ـە، واتە: ئەو قەت جێی بەدگومانی نەبووەو، هەمیشە دامێن پاکبووە، بۆیە وەک تەفسیری (سوهەیلی) دەڵێت: نابێ بیر لەهیچ شتێکی دیکە بکرێتەوە، بەتایبەتی کە (روح القدس= جبريل) بەفەرمانی خوای (قُدّوس) ئەوکارەی ئەنجام داوە، چۆن دەبێ بیر لەشتێ تر بکرێتەوە؟!. **[وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ]** مەریەم و کوڕەکەیشمان کردە موعجیزەو نیشانەیەکی گەورەو بێ وێنە بۆ هەموو خەڵکانی جیهان، چونکە تا ئەو سەردەمە شتی وا نەبوبوو و لە ئاییندەشا هەرگیز نایشبێت.

تەفسیری ڕامان

و هاتنی پیتی [ف] **سورەتی الانبیاء آیە:٩١ ( وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ ) الأنبيَاء : ٩١**

باسی مەریم و عیسا (درووديان لێ بێ):
یادی (مریم) یش بکەرەوە، ئەو ئافرەتەی داوێنی خۆی بە خاوێنی ڕاگرت، ئێمەش لەو ڕۆحەی خاوەنی بووین پێمان بەخشی و خۆی و کوڕەکەیمان کرد بە (موعجیزە) و بەڵگە بۆ هەموو خەڵکی.

ئاماژەیە بۆ چاکی پاداشت دانەوە پاکێتی ئافرەت و پاراستنی خۆی لە خراپەکاری سعدی وتی:خوای گەورە پاداشتی پاکێتیەکەی مرییم علیە سلام دایەوە بە ئایەتێک لە ئایەتەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکانی فهو من باب وقوع الجملة الثانیة مترتبة علی وقوع الجملة الاولی الله سبحانە و تعالی سوپاسگوزاری ئەو کەسە دەکات کەوا چاکەکارە و هەر خۆشی سوپاسگوزار و حەلیمە پاکی ئافرەت و پاراستنی نەفسی خۆی لە تاوان و لەگەڵ ئەوەی توانای ئەوەی هەیە نەفسی خۆی بگرێتەوە لە خراپەکاری و گرتنە بەری ڕێگەی ڕاست و درووست ئاماژە دەکات لەسەر پاکی دڵی ئەو ئافرەتە و بەرزی ئیمانی و هەروەها پاکێتی مامۆستایەکی ئیمانیــە کە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله تعالی لە خۆ دەگرێت لە ئاشکراو و لە نهێنیدا و تەسلیم بوون بۆ شەرعەکەی کە نەهیمان لێ دەکات لە کاری خراپە و

و بە دوورگرتنی جەستە لە کاری خراپ و وتنی وتەی نا بەجێ و سەیرکردنێک کەوا حەڵاڵ نیە بۆی و هەروەها مامۆستای پاکی کەوا مریەم علیە سلام لەسەری بووە کە اللە تعالی لە کتێبەکەی خۆی بۆمان باس دەکات لەم چەند خاڵەی خوارەوە باسی دەکەین

**یەکەم**: پاراستنی دامێنی خۆی پاراستنی لە حەرام لەهەر شتێک کە خراپی بکات ئەمەش لە کاتێکا بوو هۆکارێک هاتە بەرامبەری خەریک بوو تووشی کاری خراپەی بکات لەم کاتەیا پەنای گرت بە خوای گەورە و بە هەموو ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی کاری خراپە سعدی لە چیرۆکی چوونە ژوورەوەی جبریل بۆ لای مریەم علیە سلام وتی:لەو کاتەدا مریەم علیە سلام بە تەنها بوو و دوور لە خەڵکی بوو لەکاتێکا جبریل علیە سلام لە جوانییەکی بێ وێنەدا بوو و لە کاملیەتی مرۆڤایەتیا بوو و جبریل علیە سلام و نە گوفتارێکی خراپی پێی گوت داوای هیچ شتێکی خراپی لێ نەکرد و بەڵکو ئەمە ترسێک بوو لە مریەم علیە سلام و ئەمەش ئەوپەڕی پاکێتییە ئەوپەڕی دوورییە لە هەموو خراپە و هۆکاری خراپ ئەمەش پێی دەگوترێت پاکی بە تایبەتی لەگەڵ بوونی پاڵنەرەکانی بۆ خراپە و نەبوونی هیچ بەربەستێک و ئەمە باشترینی کارەکانە هەر بۆیە اللە تعالی ستایشی کرد و بێگومان ئەمە بەرزترین پلەی پاکێتیە هەروها ئەمە وەک مەقامی یوسفە علیە سلام کاتێک پەنای بە خوای گەورە گرت لەو کاتەی کە کاری خراپەی و هۆکارەکانی کاری خراپەی بۆ ئاسان بوو بەڵام ئەو پەنای گرت بە خوای گەورە

**دووەم** : شەرم لەخەڵکی و ترس لەلەکەدار کردنی سومعەتی وەناو ناوبانگی ، السدی وتی : مەریەمە علیە سلام لەبەرشەرموحەیای لە خەڵکی گوتی  خۆزگە دەمردم بەرلەوەی کەوا ئەم ناخۆشی و بەڵایەم بەسەر بێت بەلەدایک بونی منداڵەکەم بەبێ باوک ، وەدۆخەکە گەیاندی بەوەی کەوا تەمەنای مردن بکا ، وەتەمەنای ئەوەشی کرد کەوا هیچ کەسێ نەی ناسیبوایە بۆئەوەی بەنەناسراوی کۆتای پێ هاتبا، چونکە ئافرەتی ئازادی خاوەن شەرەفی دایک و باوک لەسومعەتی دەترسێ هەروەکو چۆن لە جەستەی  دەترسێ  ، وەپارێزگاری لەپاکی و بەرێزی و بەرزی ناوی دەکات هەروەکو چۆن پارێزگاری لەپاکیەتی دەکات ، وە ئافرەتی ئازادی خاوەن شەرەف و دین پارێزگاری لەناوی دایک و باوک و خوشک و براکانی دەکات ، لەبەر ئەوەی هەرچیەک بەو ئافرەتە بوترێ بە ئەوانیش ئەوترێ تەوە لەخراپی و لەزەمکردن ، ئەی نابینن کاتیک کەوا بەنی ئیسرائیل قسەیان بە مەریەم وت وتیان **(فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا﴿ ٢٧ ﴾**

ئەوسا مەریەم منداڵی نازداری خۆی لەباوەش گرت وبردی بۆلای خزم وکەس وکاری هەموبەسەرسامیەوە :وتیان ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی نالەباروئابڕووبەرت ئەنجامداوە .)

**يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا﴿ ٢٨ ﴾**

( ئەی خوشکی هارون ( لەبەر تەقواو خواناسی ئەونازناوەیان پێدابوو) تۆنەباوکت کەسێکی خراپ و شەرواڵ پیس بووە نەدایکیشت ئافرەتیکی داوێن پیس ).( سورة مەریەم ٢٨/٢٧)

لەکاتێکا مەریەمە علیە سلام بەشەرەفترین و بەرێزترینی ئافرەتەکان بو ، بۆیە قسەی خەڵکی کەریگەری کرد لەسەر نەفسی مەریەمە علیە سلام وە ترسا لەقسەوقسەڵۆکی خەڵکی ، السدی وتی : کاتێک کەوا ئازاری منداڵ بونی بۆ هات وەئەوئازارەئ چەشت کەوا نەخواردن و نەخواردنەوەی پێیە ، وە قسەی خەڵکی ئازاری بەدڵی گەیاند ، وەترسا لەوەی کەوا صبر لەسەر ئەم تاقیکردنەوەیە نەگرێ هەربۆیە لەئەنجامی ئەمەیا ئاواتی بەمردن خواست بەر لەوەی کەوا ئەمە ڕوییدابوایە هەربۆیە وتی : ( يَـٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَـٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴿ ٢٣ ﴾
(پێش ئەم حاڵەتە بمردمایەو وەک شتێکی بێ نرخ فەرامۆش بکرامایە )
ابن عطیە وتی : مەریەم علیە سلام ئاواتی بەمردن خواست لەڕوانگەی ئاینەوە ترسا لەوەی کەوا خەڵکی گومانی خراپ ببەن لەدینەکەیدا ، وە ئەمەی کە مەریەمە علیە سلام تێی کەوتوە ئەمە ببێ بە فیتنە بۆیان وە ترسا لەوەی کەوا ئەم فیتنەیەی کەوا توشی بوە بیکەن بەپێوەر بۆخۆیان موباحی

بکەن بۆخۆیان ، وەهەرلەسەر ئەم عەدە (عومەری کوڕی خەتتاب و کۆمەڵێ لەپیاو چاکان خوا لێیان رازی بێ ) ئاواتیان بەمردن خواستوە ، وەپێغەمبەر صلی الله علیە وسلم : نەهی لێمان کردوە کەوا ئاواتی مردن بخوازین ، (إنما هو لضر نزل بالبدن ) ،وە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم موباحی کردوە لە قەولەکەیدا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ (
سەردەمانێک بەسەر خەڵکیدا دێت پیاو بەتەنیشت گۆڕێکدا دەرواو دەڵێت خۆزگە من لەشوێنی بومایە لەبەر ئەوەی لەوکاتەیا ئەوسەردەمە سەردەمی فیتنەیە کەتیایدا دین لەدەست دەدات ،

تاقیکردنەوەی مەریەمەی ڕاستگۆ ڕیگای ئیستیقامەو جێگیربون هەموی پڕە لەچاڵ ، وە ڕێگای پاکیەتی پڕە لەفیتنەو لەتاقیکردنەوە ، وە ئەوئافرەتەی کەوا شەرەف و پاکیەتی هەڵبژاردوەو وەجێگیربوە لەسەر دینی پەروەردگاری لەسەر فەرمانی پەروەردگاری بێگومان تاقیدەکرێتەوە ، تەنانەت ئەگەر ئافرەتێک تیایدا پارێزراو بوایە لەفیتنە ئەوا مەریەمەی کچی عیمران تیایدا پارێزراو دەبو ، کە وا پەروەردگاری پەروەردەی کردوەبەچاکە کاری گەورەی کرد ، بەلام تاقیکردنەوە پێویستە کەواپلەی بڕواداران بەرز بکاتەوە ، وە لەسەروی نەفسەوە لەسەروی شەهوەت و شەیتانەوەیە ، وە لەسەروی شەیتان و حەبلەکانی شەیتانەوەیە وە لەسەروی خۆشەویستی دونیاو زەخرەفەکانی دونیاوەیە ، وە إعتیقا لەپێوەری خەلکی دایەو لەحیکمەت و لەپێوانەکردنیان دایە ، وە ئافرەتی ئیماندارلەم رۆژەدا تاقیدەکرێتەوە بە تاقیکردنەوەی گەورە لەشەرەفی وەلەدینەکەی وە لەپاکیەتیەکەی ، وە دەرگاکانی فیتنەی بۆشەرحێنراوە وە رێگاکانی خراپەکاری و هۆکارەکانی خراپەکاری بۆ رازانراوەتەوە ،وە خراوەتە ناو جەنگێکی ڕۆشنبیری کەوا دایماڵێنێ لەپاکیەتی و لەشەرەفی ، جەنگێکە تیایدا سفوری و خۆڕازاندنەوەی بۆ ڕازانراوەتەوە ، وە هەروەها بە چاکی دەزانێت لەنەفسی خۆیدا تێکەلاو بن لەگەل پیاو قسەکردن لەگەلیان دا ، وە وابیردەکاتەوە کەئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا ئەم ئافرەتە بەرەو پێش بچێت و ڕۆشنبیر بێت ، وە جەنگێک وای لێدەکات ڕابکات لە حیجاب و لەپاکی ، وە حیجاب وا بۆی وێنا کراوە کەوا دواکەوتوییە .

ئافرەتی ئیمانداری ئەمڕۆ تاقی دەکرێنەوە بە تاقیکردنەوەیەکی زۆر توند لە دینەکەی و عقیدەکەی و لە تێڕوانینە شەرعیەکەی

وە هەروەها بەرەو فەوزای ڕۆچونی ئەخڵاقی دەبردرێت بەناوی ئازادی و ڕێزی تاکەکەسی
وە هەروەها بانگەشە دەکرێت بۆ پێشبڕکێ کردنی هاوسەرەکەی لەوەی کەوا کامیان
دەستڕۆترن

وە هەروەها وێنای سەرکەوتنی ژیانی هاوسەرگیری بۆدەکرێت بە مەنزەڕ و چەند خاڵێکی
جیاوازی هەڵە بۆئەوەی کە ماڵەکەی بەجێبهێڵێت بۆ مێردەکەی

وە هەروەها ئافرەتی ئیمانداری ئەمڕۆ جارێکی تر بە تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت تاقی
دەرکێنەوە لە فیترەت و لە مرۆڤایەتی ئەم ئافرەتە
دونیای بۆ ڕازاندراوەتەوە
وە هەروەها تواناى بەدەست هێنانی پارەی هەیە کەوای لێ دەکات دوربکەوێتەوە لە واجبە
شەرعیەکانی بەڵکو دەیکاتە ئەسیرێک بۆ ئەنجامدانی قەدەغەکراوەکان و حەرام کراوەکان
ئەگەر چی تەمەنیشی بچوک بێت ئەگەر چی تاوانەکانی بچوک بن

وە هەروەها لەبەرچاوی ئەم ئافرەتە بەردەوام بوون و وە هەروەها پارێزگاری کردن لە
فەرزەکان و مافەکانی خودای گەورە لەبەرچاوی بچوک دەبنەوە
ئافرەتی ئەمڕۆ دژ  بە فەرمانەکانی خودای گەورە و لە هەمو دونیادا  کە بوە بە سمبولی
سەرکەوتن و پێشگەوتن

تەنانەت ئافرەتانی ئەمڕۆ ژیانی ڕۆژانەی تایبەتی خۆیان بڵاو دەکەنەوە بەوەی کەوا وەسفی دەکەن بە ژیانێکی خۆش کەوا هەموو ئافرەتێک ئاواتە خوازن پێی لە کاتێکدا هیچ بەهایەکی شەرعی وە هیچ شەرعێکی خودای گەورە لە خۆیدا ئەنجامی نادات

تەنانەت ئەم ئافرەتانە سەری هیچ کەسێک بەرز ناکەنەوە وە لە بەرامبەر ئەم تاقی کردنەوە گەورەیەدا کە لەوانەیە لە ڕابردوودا هیچ نمونەیەکی نەبوبێت

ئافرەتی ئیمانداری ئەمڕۆ لەم سەردەمەیا بە چاونەترسی و بە سەربەرزی و بە ئارام گرتن دەوەستێت

قبوڵی هەموو ئەو شتانە ئەکات کەوا دژی دەوەستنەوە و درێژە بە نوێژەکەی دەدات

وە درێژە بە ڕکوع و سجود دەدات

پاشان ئەم ئافرەتە پاکە ئیمانداره دور دەکەوێتەوە لە هەموو ڕێگاکانی خراپەکاری نەک هەر ئەمە بەڵکو دور دەکەوێتەوە

لەهەموو ئەو ڕێگایانەی کەوا لە شەرەف و پاکێتی کەم دەکاتەوە هەرەند ئەگەر بێ نرخ و بچوکیش بێت هۆکارەکە

پاشان هەموو ئەو گوریسانە دەبجڕێنێت کەوا دەیگەیەنێت بەوەی کە شوختێک بە حەیا و شەرم و بەردەوام بوونی لەسەر دین بگەیەنێت

هەروەها ئەو هەمیشە ئاگاداری تۆرە کۆمەڵایەتیەکان و ڕاگەیاندنە
نەکا کەوا شوێنکەوتەی هاوڕێی خراپ بێت
وە لە سیاقی ئەمەیا واتا مامەڵە کردنی ئافرەت لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و ڕاگەیاندندا

لەسەر ئافرەتی بڕوادار ئەوەیە کەوا ئێستا زۆربەی کچانی موسڵمان لێی بێ ئاگان ئەوەیە کەوا سنورە شەرعیەکانی خۆی بزانێت لە مامەڵە کردن لەگەڵ سۆشیاڵ میدیا
**و تۆرە کۆمەڵایەتیەکان وە تەقوای خودای گەورە بکات و ئاگادار بێت لەبەر ئەوەی :**

**1** : پێویستە لەسەری کەوا حوکمی خودای گەورە بزانێت لەگەڵ مامەڵە کردن لەگەڵ بەشەکانی وە پێویستە لەسەری کە بنچینەیەک بنیات بنێت لەسەر زانینی سنورەکانی کارکردن و مامەڵە کردن

**2** : پێویستە لەسەری ڕێگای بەژداری کردنی دیاری بکات بە شێوەیەک کەوا هەقی خودای گەورە فەرامۆش نەکات و هەقی مێردەکەی و هەقی ئەوانەی کە بە سەریەوەیە فەرامۆشی نەکات .

**3** : پێویستە لەسەری کەوا ئاسان کار نەبێت بۆئەوەی کەوا هەڵبخەڵەتێنرێت یاخود توشی خراپەکاری بێت .

4 : پێویستە لەسەری کەوا وازی لێ بێنێت ئەگەر زانی کەوا زیانەکانی زیاترن لە سودەکەی

وه پێغەمبەرمان ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی بەڕاستی حەڵاڵ ڕونکراوەتەوە و حەرامەکانیش ڕونکراوەتەوە وە لە نێوانشیاندا شوبهات هەیە کەوا زۆربەی خەڵکی نایزانن

هەرکەسێک خۆی بپارێزێت لە شوبهاتەکان ئەوە دین و شەرەفی پارێزراوە

وە هەر کەسێک کەوتە ناو شوبهاتەکەوە ئـەوە کەوتەتە ناو حەرام کراوەکانەوە

هەروەکو چۆن شوان ئاگاداری مەڕەکانی خۆیەتی

وە هەموو خاوەندارێک پێویستە پارێزگاری لەوە بکات کە خاوەنێتی ، وە هەروەها حەدەکانی خودای گەورە بریتیە لە پاراستنی

پاشان لەسەر ئافرەتی بڕوادار واجبە کەوا عیبادەتەکانی زۆر بکات لەوانەش نوێژەکانی

وە هەروەها پێویستە کەوا ڕکوع و سجود و وەستانی بە چاکی بکات

لەبەر ئەوەی کەوا ناوی بەرز دەکاتەوە وە باسی بەرز دەکاتەوە و ڕێزداری دەکات و پلە و پایەی بەرز دەکاتەوە

وە هەروەها ئیمان لە دڵیدا جێگیر دەکات

وە پێویستە لەسەری کە زۆر نزا بکات کە ئەمەش وای لێ دەکات لە چاکەکاران و گوێڕایەڵ کەران بێت ،

لەبەر ئەوەی کەوا ئەمانە سەرکەوتن بەدوای خۆیان دەهێنێت وە هیچ شتێک وەکو دوعا و پشت بەستن بەخودای گەورە سەرکەوتن و سەربەرزی بەدوای خۆیاندا ناهێنێت

